بۆ خۆ هەلکێشـان زعیم بزرگن
هەندێکی تر هەن سپلی لاورگن
(شەوبەرە) لەبەر (سپلە) دامەنێ
کەخواردیو رۆبی پێت پێ ئەکەنێ
بەلام تۆ بیدە با پێ نەزانن
لێیان ببورە، قوری زستانن
ئاخۆ گەردشی کورسی چی لێهات
هیوا: بوقاپسز ترس: بۆدەستەلات
(بۆ دۆ) بە هیوای شیری مەر ئەژی
کاتێکی زانی بەرخ مەری مژی
(بابی بابی) یە کایەی زەمانە
ئەم چەرخە چۆنە دەوران دەورانە
پەندی پێشینان هەرچەند پەسەندە
پەندی ئەم پەندە جائیزەی بەندە
ژیان: ٤٦٦
ئەگەر سەعاتت زۆر دەستی لێدەی
ئاخری تێکی ئەچێ ئەبێ فڕێی دەی

بەسەر دۆستا بۆی بەدیاریەوە
لەوەچاکترە کەین بشاری بەڕە
کەئیشێکت کرد زانیت خەتایە
بوگێڕیتەوە بوزرگی تیایە
ئەگەر لێبوردووی بۆ پەشیمانی
ئینجا لەزەتی ئەو دەزانی
ئەگەر بێی بەفن تۆلە بستێنی
خەوی ڕەحەتی لای خۆت نابینی
ئەوە جنێوت بۆ دەگێڕێنێ
کەوا جنێوت پێ دەگەیێنێ
کە دیوکەس ئاشت بن بەتۆچاکترە
هەر ڕۆژە سفردی لای ئازرە
تەسەری هەودای ویجدانت بەردا
ئەم دیو ئەو دیوت زۆر دێ بەسەردا
ئەڵێن پیرێژن بە تەفرەو مەکرە
کەبی جوانەکان کەوتوونە دەورە
بورجی پیرێژن هێشتا ماویە
جوانەژن پێشین بەندو بویە

ئەیشزانن جێی کەس بەوان نادرێ
دیسان هەوڵ ئەدەن خەڵک نانی ببڕێ
ئەوی بەناهەق نانی خەڵـــک ئەبڕێ
ئەنگەویستیو ترس بۆ خۆی ئەکڕێ
بەلام هەند کەس ناهەئەهلووێ بەدخوون
خۆیان چاوەڕێی دەرکردنی زوون

ژیان : ٤٦٧

جێگای تەنگ بووبوو ئەمجارە ژیان
گاڵتە کەوتە پاڵ پەنـدی پێشینیان
پیاوێـــك ژنی مرد قـــولێکی هانی
وتیان چۆن لەگەڵ قولـــدا ئەتوانی
وتی بـــۆ ماتەم پیشەی دێرینـــە
سەرپاك بەرگی ( تازی دار ) شینە
من بەرگی ڕەشم کردە بەر جێیە
کـــەماتەم گیری عائیلە بەوێیە
من سەگم دیـــوە لەسەرە نـــوێلك
قەپالی دەگرت لە گۆشتی تووتك

دەستم دەرمانی سەر سکی قەبزە
خامەم ڕەوانە شارەزای نەبزە

سێ بەڕۆ

ماینێکی بۆرەم بوو سواری دەبووم
ڕۆژێ بەئیشێك بۆ دێیەك دەچووم
نزیك ئاوایی ژنێکی نازدار
بانگی کردە من وتی بۆرە سوار
سێ بەڕۆ دارم ئارامم نییە
لەتۆ دەپرسم دەرمانی چییە
وتم لەم دەردە ڕزگارت ئەبێ
ئەگەر بێو دلی من بشکێنە جێ
وتی ناچارم دلت بێنمە جێ
بەلام یاخوا تۆیش ئەمەت بەسەربێ
هارو مارو دمی (باوەشەبان) بوو
هەرچی هار دەیگرت بۆئەوێ دەچوو
لەگەل پەنجکێ نانیان بۆ دەچوو
تونگی دەهاویشت ڕزگاري دەبوو

ئەمەندە هـارو ماریان چاك دەكرد
كەچی (شا پیاو) یان بەگورگی هارەرد

ئیســماعیل بەگ

سماعیل بەگی بوو رەئیسی ئەملاك
سۆفی مەشرەب بوو پیاوێكی دلپاك
وتیان قواچی بەكەت بەیێ پرسی تۆ
(غوسل) ئەكا لەسەر ئاوی بەكرەجۆ
ئەو لەشی پیسی خۆی تێ دەرژێنێ
هەرەزەكەمان پیتی نامێنێ
هەزار فێلی وا لێرە بەمێنێ
مەگەر هەر شەیتان ئەمە بزانێ

زستان : ١٩٦٨

هەندێ كە لەبڕ بەرز ئەبنەوە
كەكەوتنە خوارێ نەبزوفەوە
كەوتووەنچەنی بووی بە حەمامچی
خۆت لێ نەگۆڕێ لەرێ دەرنانی

بەڵام کەلە پڕ هاتی بووی بە کوڕ
نان خۆری دەبێ سپلەی سغرە دڕ
ئەگەر پێ بەڕێی هاوڕێکانت بێ
پێت ناڵێن کابرا نازانێ تۆکێی
هەرمووبە لەرێز ڕیزە تێ پەڕی
مەقەستی وەستای دەلاك ئەیبڕێ
نەخوزەلاوا (زەیل) کەوتوتە نـــاو
هەرچی بەرکەوێ ئەلێن کالە بڕاو
بۆ کالکە قـــولێ دەچنە لای داپیر
ئەمان نێرێتە لای بزن بۆشـــیر
شیری داپیر خۆر بێ کالە ئـــەهێنێ
سەگ بەشێری کەلە ئێمەتان ئەشکێنێ
پیرەمێردێ هات پێی وتم: پێری
هەر کەس لەباری خۆی گوێز ئەژمێری
ژیان: ٤٧٠

ئای بۆ ئەو ڕۆژەی ترس دێ بەسەرا
کوونە دشك لامار ئەبێ بەسەرا
کە کەوتینەوە کۆمەڵی یاران
ئەلێی: نە ساڵان دیوە، نە باران
کۆیێ دواییی هەمەوەند ئەیگوت:
های جوامێر ارۆمو عەجەم وا ئەدووت
سەری کە ساڵان بەتەمای نەبن
بۆ ئەوە دەشێ هەڵکەندرێ لەبن
ئەو ساکە چو مێر دەنگی دڵێر بوو
تیپی هەمەو ند ژنیشیان شێر بوو
قیمەتی هەسیم (دڵ دڵ) م پێیە
ئاخۆ ناپرسی لەشکرت کێیە؟!
لەهەمووی خۆشتر خەیاڵ بازییە
جوکمی سەری بەنگ یەکەتازییە
خەیاڵ بازییە چارەی دڵتەنگی
شەراب بەکەردەش بەزلێ بەی دەنگی

بەڵام بەنگینیشی بێ مەچۆرە گۆی ڤاو
جۆگەلەت لـــەلا ئەبێ بە شـــەتاو
هـــەرخۆم ئەزانم شـــەراب بکەم نۆش
گوێ زەلم و ماسی سەوزی و هەوای خۆش

ژیان : ٤٧١

جووجەڵە دووی خۆی بە نێمە داوە
کە بێبن پێشکەوین بۆ پێمان داوە
بەکێ کە سەری لەهێلکە جووقـــا
توێکڵی شر دەکا لەژێر دەندووکا
ئێمەیش ئەو خاکە جێی سروشتمانە
زۆر کەڤەی ئەدەین خووی پووشتانە
دەورانی هـــیچمان لەناوا نیـــە
ئەمان لەگەڵ ئەو بۆشەی شەڕیە
کەویش خوویەکی خۆی پێ بەخشـوین
دیارە بۆ ئەوە شـــایستەی دێوین
کـــەو دەبـــەنە ڕاو بەفێڵ دەخوێنێ
هاوجنسی خۆیان بۆ کووشتن دێنێ

ئێمەیش نەزبیح و زیکرو ئیستیغفار
کەچی کەشکۆڵمان پڕە لە ئەخبار

دەبینین برسی و کەسیرەو کزین
دانیشان نەدەنی دەستیان ئەگەزین

بەذەیلی (ذەیل «١») یش نایەینە ژێر بار
ذەلی دڕێژەی سەندووەک ڕۆژی بەهار

تا نەبوینەوە، ئەی نابڕێتەوە
وادیارە تا دێت ئەتەنێتەوە

زمان : ٤٧٢

دنیاکەی فانی کاروان سەرای ڕەنگ
نیوەی دڵشادەو ئەونیوەی دڵتەنگ

ئاوێنەی دەوران دوو چشمت ئەنوێنێ
خەتە شیزینێ و کلاو فڕێنێ

---

«١» ذەیل = مەبەست قانونی (ذیل قانون انضباط موظفي الدولة)

کە کاربەدەستی میری پێ لائەبرا لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە

بە عەشایەری دەعوا حەل دەکەن
شاگرد شەق ئەخوا و وەستا تێئەخەن
لەخەت دەرمەچۆ مەکەوە دەرە
دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگرە
لەکەری تۆپیو مەگەڕێ بۆ ناڵ
ڕۆژێکیش دەبێ تۆ بخێنە چاڵ
دەستەی خۆی دەوێ کەخاوەن دەستە
دەستەکەوتەدەست دەستی نەپەستە
ئەوکار بەدەستەی کەکار شوناسە
کردەوە ناسە خاتر نەناسە
ئەوی بەخاتر ئەمڕۆ دانەزرا
کەچەرخەی گۆڕا پەتی ئەو پچڕا
ئەو پیاوەی پیاو بێ ئەونیشەی ناوێ
وەک ماین چەقەڵ هەرکەسە تاوێ
ئەوی بەهیوای ڕجاو بەرتیل بێ
ئەبێ گوێی دایم لە زڕەی زیل بێ

باوەجوود ئێستا عەکسی ئەوەیــە
ئەبینن دەوران بۆ یەك شەوەیــە
دیــارە ئەو باخە کە نــایەتە بەر
( بریسی یا پارە او پری بــوزر )

ژیان : ٤٨٥

هیچ کەس نازانێ کەم ئەم دنیایــە
چەند هەمە چیزەی ڕەنگ ڕەنگی تیایە
یەکێ هەر لە شوێن پارە عەودالە
لە مــــــکێن بووە بــە زەردەوالە
وەك هەنگ لەم و لەو هەنگوین ئەگرێ
کە پێ بەوە نا دــەچی خۆی ئــەمرێ
کەم پارەداوم دیــوە تێر بخــوا
بۆی دێتە بەرهەم لەبر خوی ئــەڕوا
پارەی میراتیش میقرۆبی شــەڕە
برای میرات خۆر دەست بەخەنجەرە
وەرە بنــوارە دەعوای مــەحکەمە
ناژەرتوی بێ هــەی ئەلێ کەمــە

هەندێکی تریش کەوا بێ پارەن
هیچ قەدریان نی یە لەگەڵ ئاوارەن
هەر بەو داخەوەن ئەڵێن ، ئاخ پارە
دنیـا بۆ پـارە لەگەڵتا یـارە
دەولەمەند پارەی بە کەس نەداوە
ئەم گشت عالەمەی ئەڕوا لە دواوە
هەندێ کەوتونە دەریای سیاسەت
بەقینەبەری بوونـە سیاسەت
قینیان لەوەیە ئەم ( داهی ) یـانە
زادەیشن نین سەریان لە ئاسمانـە
کردەوەت باش بێ چاکی و بەڕێو جێی
کە خوادای هیچ کەس نالێ ، کوڕی کێی
هەندێ خوا بۆ شەڕ هێناونیە دنیـا
وەزەندی خەڵکیان ئەوێ بەزەنیـا
کەرەی جەلالاد بوو دەیوت : دەقچێنم
بەلنکە فرتێ نەشئەی خۆم دێنم

ژیان : ٤٨٦
دیسان خومخانەی جوولەکە شێوا
درۆی باڵداری لێ کەوتە هەوا
دەوەن بە ناشەو دەرەبەگی یە
پیر لێی تەریکەو وتیا دەرەگی یە
یەکێ بەگورزی لەندەهوور ئەخورێ
نان و دۆی تیرەی شیر زادی دەبرێ
ئەوی تر دەڵێ: لەندەهوور کێیە؟
شیر زادی نامەی فەتحیان پێیە
شەڕی عەنتەر و ڕۆستەمی دوستان
لە ناو ئێمەدا بوو بە داستان
یەکێکیش دەڵێ : لای خودا و بەندە
سورەتی یاسین گەلێ پەسەندە
خۆ ئەگەر یاسین طاهای لە دوا بێ
کەخوێندت ئەبی کارت ڕەوا بێ
٠٠٠ ی خۆمان سەر مەلا مانە
بەو حەل ئەکرێ ئەم ڕازی نیهانە

ئەلێ: بە هیوا کەس لێت نابرسێ
دەنگی تۆپ نەبێ هیچ کەس ناترسێ
( حاجی ئەمین ) یش ماچۆ : بواچە
نوێژی جەعفەری و تەشریبی پاچە
منیش ئیمانم بەوە مەتێنە
عالمی بە کار دایم ئەمینە
وتیان: مەلا هات وتی بە تۆچی
وتیان تێپەری ، وتی : بەمن چی
پارەی دەولەمەند لە قاسە نەنوێ
فەقیر لێی نەدوێ تاچەنەی ئەسوێ
وا دەزانن ئەو یا ئەم بێتە ناو
ئیتر بۆ ئێمە تیر پرە لە چاو
ژیان : ٤٩١
فیرعەون کەوتە نیل وتی : لەترسا
ئیمانم هێنا بە رەبی مووسا
( ئەبو تالب ) یش بەتەعنەی ژنان
بە پێغەمبەری نەهێنا ئیمان

ئەویان بۆ ژیان، ئەم عیززەتی نەفس
بی عیززەتی نەفس کەس نابێ بەکەس
وەك کابرای کوردە شیریان نایە سەر
(نووح)ی وت، بەڵا نەیوت: پێغەمبەر
لای هەندێ مادەی ناموو س بەتاڵە
لەمەودارادا وەك پەشتەماڵە
لەقومیدیادا ئافتوری ماهیر
هیچ ڤالصۆیەکی لێ نابێ زاهیر
هەندێکیش فرویای زوو دەردەکەوێ
مایەپووچیان هەر بەردەکەوێ
نیشکی مۆریاس و هەرزنی ڕەنگاڵ
بێ بەروپشتن بۆ کەس نابنە ماڵ
ئەوانە ڕاستیان چۆن دێتە سەر لێو
دەم بەپێکەنین دڵیان پڕ جنێو
لەگەڵ یەك زاهیر دۆستی دەنوێنن
خەریکن ملی یەکتر بشکێنن

هاکا لەڕووی کار پەردەهەڵگیرا
ئەزناق بازڕۆڵی لە قەڵبە گیرا
وەزیفەی گەورە زۆر پیاو گێژ ئەکا
پیری، شاعیریش فرە بێژ ئەکا
ژیان : ٤٩٨

زستان شەوارە بوە بە چرای نەوت
زۆر کەس بە هاوین بەشەوارە کەوت
بەچرای گەرچەك پەکتر نابینن
بۆیە وەك چرای گەرچەك بێ تینن
شەوقی کارەبا هاتە کایەوە
جۆم بۆ لە کادا نە شارایەوە
یەکێ لە [ کفری ) لەرێ کفری کرد
خەڵق بە خێرەوەمەند ناویان ئەبرد
یەکێ خێر ئەکا بۆ رۆی خانەقا
کەچی بێ ئینساف کافری دەکا
شێخی بایەزید ناحەقی نەبوو
... ... وی : با بسووتێ و شاو تەڕ ھەموو

قەزاو ناحیەو مەکتەبە کـــەمان
هەموو شاغیرەن ئاکرێنە خەرمان
دنیام لەبامیەو بریانی پڕ کـــرد
هێشتا بسـم‌الله بسم‌الا ەي نـەکرد
هەرچی باینجان خۆر بێ لە ژووره
بسم‌الله ومره تۆیش لێی ببووره
تاکەی ئەم چەرخەواچەپ دەگەڕێ
تاکەی کەره دێز بەجۆ دەزەڕێ ؟!

ژیان : ٤٩٩

ئەگەر دێکانی خاوەن بــەخت بێ
شاخی ئــەزمری وا بۆ تەخت ئەبێ
کە عەدالەت بوە قەوپان زەعیفە
زۆر، کەم بۆ باوی جنسی لەتیفـــە
هێشتا تێ ناگەیێ لە چاکی ژنان
زەعیم خۆی خستە کراسی ئەوان
بەهاوار وتم : ئاخ هەور، ئــامان
هەیکەره ناقکەی زەڵمی هەورامان

تەختی هەورامان بەختی هەڵ پێکا
کۆی ئاتەشگایان بوو بەئاتەشگا
گەردوشی دەوران ئەم دیوەو دیوە
ئەم خاکە زۆر جار ئەم حاڵەی دیوە
من ئەم گوت : زەلم ماسی لی بـــرا
کەچی هەیند زۆر بوو گونیەکەی دڕا
ئۆتۆمۆبیل چـــوو بـــۆ قەلاّدزە
دەچمە سندۆڵان بـــۆ ڕاوە بـــزە
مەنسوری هەللاّچ بە چەکەو کەوان
ئۆتۆمۆبیلی بردە ســـەر کێوان
پێشینان دەڵێن : خوا هەر ئەو خوایە
ئێستا کەبزن وا سواری گـــایـــە
بەراز کوژ دووسەد فلس وەر ئەگرێ
بۆ بەرازی شار بۆچ نرخ نـــابڕێ
لۆقەنتە چیەان (خەرە «١» لامپۆز )ە
بێ بسم اللەیە چێشتی پڕ تـــۆزە

١» خەرە لامۆز = کابرایەکی ئەرمەنی بوو لە سلێمانی چێشت کەر بوو .

ژیان : ٥٠٠

بەئێستریان وت باوکی تۆ کێیە
وتی : ڕەسەنی دایکم پێیە
چونکە دوو ڕەگەو تۆوی حەرامە
هێشتا جاشکی خۆی نەدی ناکامە
تانجی لە ڕاودا هونەر دەنوێنێ
نەوەی سەگەو گورگ ئەخنکێنێ
عابید مشکی کرد بەکچو سەرپشک
ئاخر نەوەستا بووەوە بەمشک
ئەڵێن گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێ
بەلام بێستانیش بژاری ئەوێ
بێستانەکەمان پڕ لە بژارە
بۆیە مالیات مافەتە دارە
بەرازي ناو شار شەرحێ نەبوو بۆي
هەرچی دەیبینی دەیباتە سەرخۆی
کرچ ـ ڕەی ڕادیـۆ بوارەی نایە
بەنـ بەحالی خۆم (بلوێر بۆ گایە)

ڕەحمەت لەو کەسەی لەسێ نەکوژێ
لــە باخەڵتایە و خوێنت ئــەمژێ
دەر بارەی ناکەس پیاوەتی مەکــە
بیبەیە کەعبە دیسان ئەڵێ لەکــە
هەندێکیش ئەڵێن : کەئێمە ئەبین
ئەهلی مەملەکەت ئەکەوونە شــین
قازانی خۆیان شەینیش و شــێنن
تەنها قازانجی خۆیـان ئــەبینن
ئەگەر خوا دەکا خوێنمن دێتەکـار
ئەوســـا تەجرەبە دەگاتە بــوار
ژیان : ١٠٥
پـایز ڕوو زەردی خــەزانی هێنـــا
[ڕەعد«١»]یش قامچی خۆی ئەهەور داهێنا
دەمێکــە بــەرگی هەتیــو دڕاوە
زۆر، لەبێ دەستان لای چەرخیش باوە

«١» ڕەعد گرمەی هەور .

ئاسمان سالی چوار جار ئەگۆڕێ
بەختی کورد هەموو ڕۆژێ دەتۆرێ
خوا کێو ئەبینێ بەفری تێ دەکا
بەندەیش هاستاوی ساردی لی دەکا
سروشتی ئەزەل وەك بازو کەوە
لەجێیەك ڕۆژەو ، لەجێیەك شەوە
دوێنێ خەتیب مرد ئەمڕۆ شاییە
بۆیە دەڵێن : عەبدلەخۆی باییە
ئەگەر قابینە(١) ارجار نەگۆڕێ
سەودای وەزیری دەچێتە گۆڕێ
سەری بێ سەودا تۆپی فوتبۆلە
مالی بێ ئاهەنگ کەلاوەی چۆلە
[ بزەن بەرندان هرچی بادا باد ]
بە بادە غەمی دڵ بدە بە باد
سیاسەتی ڕاست هەرۆ مەڕۆیە
ترسنۆك بەشی هەرباوکە ڕۆیە

(١) قابینە — لەنجومەنی وەزیران .

شێر چۆن لە دەنگی دەهۆڵ ئەترسێ
کەژنی خۆی بێ کەی لێی ئەپرسێ
کەری خۆمانیان کرد بە ڕەوزن
بوو بە قاڵەی دەم کاڵەی درۆزن
شەریان پەلاس بوو بۆ توقات لێدان
دەختە دەست بکەین بە توقات لێدان

ژیان : ٥٠٤

پەلە × وەك پەل دای لەسەر و گوێلان
دار و خەڵووزمان لێ بوو بە تریاك
باران ڕەحمەتە و خەڵك لێی ڕادەکا
خۆ ڕۆژووەوانیش بەرد بەبا دەکا
مەزنوم جوێن ئەدا و گوفای بارانە
ڕەمەزان بە جەنگە و سەفەر بەد نامە
بەنەوتی قیرتاو سەوز ئەبێ شاری
خەتای بارانە کە زۆر دەباری

× پەلە = مەبەست بارانی پەلەیە

خەڵك لەماڵی خۆی ڕۆژوو ناگری
سۆفی گوناهی حکومەت ئەگری
ی نەوایی یە شەڕی گوێی گوانوێ
بادار نانی جۆ دەکا بەبیانوو
چەتە کەکز بوو نوێژکەرەو چاکە
گورگ کەلبەی نەشکێ پاوەڕێی لاکە
ڕەمەزان سێ ڕەوتی لێ گرتوینەدار
حەوت تریکێکی و خومار و قومار
ئەڵێن . . . بەگ خۆی بە ڕۆژوە
دوای خۆی بڕوانێ کەکوێی لەدوورە
بەتەنها گوێێ بەهارمان نابێ
هەر هەزی بگری کولێرەی تیابێ
ژیان : ...
تۆ تەنها ئ انت لەمەنان بوێ
لەدژو نان، دوو نان سنانی ئەوێ
بەخشین : عیزەتەو داوا داوی عار
دوو نیش داواکەی ئەبێ بە بیمار

هەر عیلمە داوای بکەی عەیب نییە
چاو بەرەوژێری لەززەتی چییە؟
کەچاو ببڕیتە دەسندەی خەلکی
ئەکەویە ژێر بار ، دیارە بۆ کەڵکی
ئەو هۆزومنەی زابەزبان دۆستە
ئەلخەناسۆکە ، ئادەمی پۆستە
نزیك ناوانی مەغرور مەکەوە
هەکەسێ پیاو بۆ ئەرقینی لەوە
تابەچاوی خۆت چشتێ نەبینی
ڕاستی مەزانە عیلم الیەقینی
چونکە دەور دەوری درۆو بوختانە
ڕاستی گرانە درۆ هەرزانە
ئەوی لەخەلکا بەعەیبی ئەگری
کەلەخۆتا دیت ، شادمەبە بگری
لەقسەی خەڵکا زۆر هەڵمەدەرێ
ڕەوایە ئەگەر بتکەنە دەرێ

هەلکردت بێتە سەر نانێکی جـــۆ
زینهار لەماڵی ڕژد نانی مـــەخـــۆ
هەزار دۆستت بێ هێشتا کوکەمە
تەنها دوژمنی بـــێ زۆر ستەمـــە
هەر چەند کەسەفەر سەنگی محەکە
ئەوەی نەیناسی ، هاوڕێی مەکـــە
کەمت لەزۆری حەڵکی چـــاکترە
گۆشتی چۆلەکـــە لەدال پـــاکترە
لەدڵی خۆیشتا ، خۆت هەڵ مەکێشە
لەخۆد پەسەندی ، دۆستت دل ڕێشە
نادان سەد جاری هـــەلگێرێتەوە
دیسان هەر لەفزی خۆی ئەگرێتەوە
مێشە سەگانە کە سەگ مەگەسە
وەریشی گیری هەروا ناکەســـە
بۆ قرۆش بزنی خەڵك مـــەدۆشە
شیری تۆ بەرن چەن لات ناخۆشە ؟

هەرچی چاکەی کرد ، چاکەی دێتە رێ
درەخت بنێژی دیارە بەر نەگرێ
ژیان : ٥٠٦

ئەگەر تۆ باوکی خۆتت خۆش ئەوێ
جوێن مەدە، ئەوەک جوێنی بەر کەوێ
کەنیشمی دەرزیت بێتەوە بەر چاو
سوژن بەخەڵکا نـاکەی ناحسـاو(١)
مردوو گەشەیتان یەنەی بەر داوە
هەرچی جنێوی پێدا بەدناوە
نوێژت بە قەزا بۆ دەگەڕێتەوە
سوحبەتی یاران چور ، دەبڕێتەوە
ئەوی حەق ناسەو بەحەق رازی یە
چ ئیحتیاجی بە شاو قازی یە
زۆری زانینت کە کردە بەرت
تاجی ئەدەبیش بنێرە سەرت

(١) ناحساب = بێ حساب ، بێ لێکدانەوە .

دڵ ئـــاوێنەیە ڕوونـــاکی ئەنوێنێ
ئاگاداری بەژەنگ هـــەڵ نەهێنێ
لە ئاهو نزای مـــەزڵووم بترســـە
ئاهی چەند ماڵی ڕووخان ، بپرسـە
لەوە بترسە لـــەخوا نـــاترســێ
دەم هەڵبڕە دەم ئـــەبڵەو ناکەســـێ
بزانـــە گەوهەر چۆن بەبەرد ئەشکێ
مـــەرەکـــەبی ڕەش پێتا ئـــەلکێ
هەرچی بـــەئاغاو بەپـــاشام فێـــرە
ئەوەنـــەی خۆشـــە هـــەتاگوو تێرە

دە پەنـــد

دەپـــەندەی یـــەکی دە دینار دێنـــێ
دیاری ژیانـــە . خـــەڵکی بیخوێنێ
١ — لەگەڵ خوادا سەر ڕاست بە چاکە
هـــیچ نەوون نـــابێ خراپەو چاکـــە
٢ — لەگەڵ خەڵکدا ئینساف بنوێنە
٣ — هەتا دەتوانی نەفست بشکێنە

٤ - بۆ هەژار دلسۆز ە - بۆگەورە حورمەت
٦- بۆ لەخۆت خوارتر لوتفو شەفەقەت
٧ - بۆ دۆست ڕابەربە ٨ - بۆ دوژمن بەحیلم
٩ - بە نەوازع بـــە لـەگەڵ ئەهلی عـــیلم
١٠ - لەگەڵ جاهیلدا بێ دەنگو خـــامۆش
ئـــەم دە پەندەی من نەکـــەی فەرامۆش
کـــلیلی گـــەنجی پـــەند دیانەتە
دین نەبێ پەندت لەلا زەحمـــەتـــە
ژیـــان : ٥٠٧
شەرمت : ئالەتەو شەهوەت : فەرەنگی
زۆر بلێ : نەگبەت عیززەت بێ دەنگی
تێر هەڵچوو : دایم سەر لە بـــەلایە
گرێ گیر هەرگیز کشەی بەر نایە
سەرخۆش بە، بەڵام دەنگت دەرنەیە
دڵ گـەرم بێو گـزەت لێ نەیـــە
بەو داخۆش بـە کەلێن بـــپچڕن
نەک پارمت بەنێو مەردیت بـــکرن

تا تالڕو سـوێری دنیـا نــەچێژی
هەرچیت هاتە دەم ئەوە ئــەبێژی
بەقاڵ کراوی کـەهاتیە کـــایــە
گوێزت لێ بارکەن خڕەت لێ نـایـە
ئەگەر ڕەفیقت کەوت دەستی بگرە
هەرچی بێ ئەویش ئـەوەی لە فکرە
بەلام ڕۆرە پیـاو بــە هیچ نازانێ
قــەدری مــەکرە بــەلەتەنانێ
هەندێ کەوتوونەسەودای مەحوسی
زۆربان هەوڵدا خودا نەینوســی
ئەم جارە نۆرەی تازە قەلدایــە
بگرەو بەردەیە هەوڵو هەلدایــە
خەلك وادەزانن بە دەست لێرەیە
هەر ئەو خەرمانەو هەر ئەو گێرەیە
گای بنەوەك گای ژێر زەمین بەندە
بەئێمە نالێن : کەرت بـە چەنــدە

باز هەڵدەن مەبعوث پێی بڵێتە کسایە
بەڵام پاز چاوی لەگۆشتی گایە
ژیان : ٥٠٨

قەدری خۆت زیادکە بە قەدر زانی
خۆت نەبێ هیچ کەس بەسوڵ نەزانی
وەك گلێنەی چاو : عالەم دەبینێ
تەنیاو جودی خۆی لا نانوێنێ
هەر چەند دەور دەوری خۆ هەڵکێشان
خۆهەڵکێشان وەلا سنگ هەڵکشان
لای هەندێ جنێو : ئەدەبیاتە
هەندێ بە خەیار ئەڵێن زەڵاتە
هەندێ گەباو گەوت پێی ئەڵێن گەرە
هاتەوە ڕووی کار، ئەڵێن : جەوهەرە
قەترمی حەیایان لەلا تکاوە
ڕوو بە ڕوو شەرمیان لەلا نەماوە
ئەگەر ئەوانە وانەبوو نایە
بە چاکی بۆمان ئەهاتنە گایە

تۆ لەو کەسەنە هەمیشە دوور بە
لە کونجی خۆتا هەڵکەو ڕوو سوورە
نەسیحەتێکیان کردووین زۆر چاکە
ئەڵێن خاکی بە، ئەسڵت لە خاکە
ئەگەر بۆ کەڵکی خۆت گەورەت بوێ
بڵێ: خانوو پەلا ئەکەم بۆ شەوێ
گەورە ئەوەیە کەچاکەی عام بێ
نەک دەورو پشتی خۆی لێ بەکام بێ
ژیـــان: ٥٠٩
چەند خۆشە ئینسان خەیاڵ پەروەر بێ
بە خەیاڵ بەرگی شاهی لەبەر بێ
هەرچی ئەیناسێ بیکا بــە مەئموور
خزمانی شــادکاچ نێزیک و دوور
مادام خــەیاڵە لــە ڕەنج بەدەرە
خورمای بێ ناووک خۆ چــەوەندەرە
ئەو ... تــۆ ئەمڕۆ ئەیبینی بەچــاو
... لەلات خەیاڵێکە: خــاو

وابزانە کەتۆیش مەبعوسی بووی پار
خاوەن کەش و فش نۆتۆمۆبیل سوار
خۆئێستا هەموولێك ڕاست بوینەوە
تەنها تۆ دەزووی بەپشتێنەوە
فەرز کەئەمجارەش ئەچەسپێتەوە
بە هێلم پێوە ئەلکێتەوە
نەمێوت هەیە بۆ کەس نەهەنگوین
مەگەر چزووی خۆت بکەی بە پەرژین
ئای جاران یاسین صلی الله هووی بوو
ئێستا نایخوێنن مەگەر بۆ مردوو
هەرچی کەس حوکمی ئەمە بزانێ
ئەبێ (ئاسەف) بێ بۆ سولەیمانێ
تویش سولێمانیت، های سولەیمانی
یای نیسبەتت بوو بەیای نسیانی
ژیان : ٥١٠
شێرە بەفرینەش وا توایەوە
بۆ ئۆتۆمۆبیل ڕێ کرایەوە

زۆر کەس بۆ بەفر چاویان ڕشتووە
زۆریش لە هیوا دەستیان شتووە
کوێر تاکو دەمرێ بەهیوای چاوە
لیستەی یانسیب زۆری نەماوە
دیم بۆکیان هێنا بۆ مالی زاوا
لەسەر مارەیی بردیانەدواوە
سالێك مەبعوثی ڕەئی بۆ درا
کە بە پەکێکی تر داخل کرا
نەسیب و قسمەت عیلمی غەیبە
ئەوەندە هەر چاپوك دەستی بە
ئەمسال مەبعوثی پەنجەی پەنهانە
عیلمی غەیب زانین لایق پەریانە
یەکێ شەمالەی بۆ ئەگرێتەوە
یەکێ دانولە ئەبەشێتەوە
بەزیندە خەوی پڕو پێ ژن
زۆر کەس بۆ سەیران بۆ بەغداد ئەچن

وتیان : تــۆ بنوو بیبینه به خــەو
وتی : لــەتاوان خەوم نیه شــەو
خواله مه‌جنونی پرسی ســەودا ســەرا
عیبادەتی چیت هێنایه مەحشــەر
وتی : هێند عەشقی لەیلام لەلابــوو
لەکوێ هۆشم لای خوای تەعالا بــوو
لــە لادەمەوە ، تا لــەم زەمانــە
ڕێگای خێرو شەڕ بەدەست ژنانــە
کۆنە دەماخان هــەروا نــادانــن
هیچ قەدری جنسی لــەتیف نازانن
ژیان . ٥١٢

لــەلفی مرادت فــرێدا ســەردی
شوێن مراد کەوتی بۆ درەم (١) مردی
ڕۆژوو نەازت (٢) کە بۆ نیاز بــێ
وەك عاشقێکی کە پیشــەی گاز بــێ

(١) درەم = درهەم = پارە . (٢) نماز = نوێژ

نـوێژی زۆر بیشەی پرێژنـــانـــە
ڕۆژوویش ئەسڵەکەی بۆ ڕەمەزانە
سیاحـەتی حەج سـەیـری جیهانـــە
ئەوی بەکاربێ بـەخشینی نـــانـــە
کـــابە بنـــاغەی برایمی خەلیلـــە
دڵ نەزەر گـــاهی ڕەببی جەلیـــلە
دڵ دەشـکێنی دەچێ بـۆ کـــابـــە
مەجۆ مەزالم لەسەر خــۆت لابـــە
من زیارەتی کـابەم کـــرد بـــەلاّم
زیـــارەتی دڵ پێشــــترە لە لام
لەدەشتی مینا قوربـــانی دەکـــەی
بۆ گورگـو چەقەڵ دیاري دەبـــەی
لێرەی سـەربڕیو بیدەی بـەبرسی
ئەبێ بەقەلای ئـایـەتـــە الــکورسی
دەزانی کـــەوا دنیـــا فـــانیـــە
وای دەگری تاسەر زیندەگانیـــە

ئەگەر تۆ تاسەر هەر بژبایتایــە
ئەشیا بۆ دوای تۆ جێگا نـەمایــە
وەك پێش تۆ جێگای خۆی داوە بەتۆ
تۆیش جێی خۆت بدە بەیەکێ و برۆ
ئەگەر بێ داگرێ و ملێ من نارۆم
تۆش وەك یارۆ کان ئەهاونە بن گۆم
گا لەسـەر پشـــتی مـاســی دانرێ
ترە کەلەکێ دیــارە ســەر ناگرێ

ژیـــان : ٥١٧

خوا ڕەوای بینی واتلك هەلگیرا
داپیرەکان خنکان لەپیری شیرا
مادام الکەی کـــلك نـــەما لەنـــاوا
عەدالەتێکی شـــەرعیمان مـــاوە
شەرع ئەموو کارمان بۆ دەبڕێتەوە
گەمانیع هەلسا مەمنوع دێتـــەوە
ئێستاهەرکەسێ بچێتەوە جێی خۆی
توجەی انضباط حکم بـــدا بـــۆی

مەلای مەزبووره کەچوو بووه ناو گۆڕ
گۆڕەو شاری داسلی ئێستری تۆڕ
پرسیان : چـۆنه ئەوەو دنیـایه
وتی : ئاخ ئەڕێش قەتارچی تیـایه
بەخوا ئەگەر تۆعال و سال ئـەبی
لەهەر دوو دنیا بێ سۆال ئـەبی
بەلام دونیەی چەور بێ بەلاییـه
شوێن چەنه ئەوتن بـۆ تالانییـه
تەماته ماسی بگری ئـەڕنـەبی
قومار بازیش بی ئاخر شەڕ نـەبی
شتر موو ئەلێن : وەره هـەڵفڕه
ئەلێ : نـابینی ملـم وشـتره
ئەلێن : باربەره : ئـەڵێ : بالدارم
تەنها بۆ خواردن نـازانـەکارم
زیان : ٥٢٠ ساڵی ١٩٣٧ ز
بوو کە بارانێ کەوتـە کۆلانـان
خۆی کردووه بەبووکێکی باران

دەغڵ و دان مل کەچ، عەلاف بە دەماخ
هەژار و شکەڕۆ، دەوڵەمەند چالاخ
سەیرانگا جێگای نوێژی بارانە
جۆشی گریان و فرمێسک بارانە
لەعیب فەرمووییە کەدین نەماوە
غەزەبی خوامان والێ گیراوە
هەڵپەرکێ و سەیران ئەکەوتە شارێ
لە باتی ڕەحمەت غەزەب ئەبارێ
سەیرانکەر منم، واعظیش ئەوە
لێک ناکرێتەوە ئەم ڕۆژ و شەوە
بۆچ تەنها ئێمە بێ باران ماوین
کەوا فرمانی کفریان داوین
یا ڕزقی ئوممەت هەر بە بارانە
کەوا بێ تەنها باران خوامانە
کەس ئەو بێکەسە کەلە (بێکەسە «١»)
نەهری هەڵقولاند بۆ ئێمە بەسە

«١» بێکەسە = شوێنێکی دێمە لە شارەزوور ئاوی نیە

ئەگەر خوا ڕزقی بە نوێژ بدایە
ئەشیا غەیرە دین نانی نەبوایە
نە ڕزق بە دینەو نە ماڵ بەزانست
ئارەزووی خوایە ڕۆژی ڕووی ئەلەست
زۆر کەس مەعاشی زۆری دێتە ڕێ
هاتە وەرگرتن ڕێی لێ دەگۆڕێ
لای چاوی ساغی بۆی ئەژمێرن
دز بۆ لای چاوی کوێری ئەنێرن
کەوەکە وتی بە بازی ئەحمەق
نەی نێبتە تەبەق مەیەژە صدق

زیان : ٥٢٠

دەستەی تیاترۆ بەعیشوەو زۆر زان
گەیشتنە سەرمان فەسڵی بلینجان
دەنگی دومبەڵەك کە گەیشتە گۆش «١»
سەودای سەر و دڵ تێکڕا دێتە جۆش

گۆش = گوێ .

شەوقی کارەباو بۆیەی سپی و سوور
بەشەو پشیلە دەکا بەسەمۆر
ئێمە نەزەرمان هەروا کەچ بینە
ڕەنگی سەنعی مان لە شیرینە
بە دوو فیشالی لاف عەلمراڤ
[نالە پیڕپان ١) مان لادێ بە پیاو
جاران بە تەقەی دەمانچە پیاو بوون
بەدزە کوشتن بەناو شاو بوون
ئێستا بەتەقەی زمان ناو دارن
تەنها بۆ نەفعی خۆیان بەکارن
پیشەی پێشموشمان لێ دەڕژێتەوە
ئاغایی لە نوێ دەگەڕێتەوە
خوا گێو نەبینێ و بەڕێ تێ دەکا
ئەوە بەد ناوە قسەی لێ دەکا
(١) نالە پیڕپان = کابرایەکی چەتە بوو سالی
١٩٠٩ و لە سلیمانی بەدار .

ئەلێن : خشمت هاوێژ پاداشی سە ەنگە
بۆ واتەی گاڵتەی قە ـدی گوشت نەنگە
بەڵام خویەکی گرتەمان بەشێی
ناتوانین تەرکی بکەین بەپیری
مەگەر نەوخوایە کەحاڵ ئەگۆڕێ
چەهلمان لەگەڵ نەخاتە گۆڕێ
خۆ من هەڵەمو زبانم سوا
هیچم پێ نەکراو خەتمە دەست وا
ژیان : ٥٣١
شاری ئاژێکی خەم ڕەوێنیان بوو
ئەیان خواردەوە عەقڵیان تێك ئەچوو
یەکێ لەلاوە هاتەناو ئەوان
بەشێت یان زانی کەوتە بەر زبان
هیچکەس لە عەقڵی ئەو ڕەزانەبوو
لێك کەوتنەڕوو ، مابەینیان تێك چوو
دوایی کەزانی تەنها مایەوە
ئاوی خواردەوە ، کەوتە کایەوە

به (وروپا کلاسون) به (چال اونیاسون)
خۆشیان رائه وارد ئەوانیش وەك مـــن
بـــەلام مـــن بەبێ ئەوە دەبـــەنگم
قەڵەندەرێکی بێ فـــام و نەنـــگم
ئەوەندە هەیە : یەك ڕوو یەك دڵـم
لە مەتانەتیدا بـــەروەردەی گـــڵم
هەندێکی وا هەن هەســاڵی مـەککەن
ـــەما بەدڵی گەورەکـــانی ئەکـــەن
بە مێچکە منچکە بۆ ئەڵێـــنەوە
کەهەڵ خلیسکا خۆ ئەکێشـــنەوە
ئەمە تەجرەبەی ئەوەندە ســاڵـــە
هەرچی باوەڕیان پێ بکا منـداڵـــە
باوەڕبوو ئێستا منداڵ بەســـەندە
کەس بە پیر نالێ : گەورن بەچەندە؟
پیر قران داهات، تو خوا بابەـــرن
خووی چڵو حۆیی ئەم دەورە نەگرن

بەواتە واتـــە پیاو ئەبێتـــەوە
خـــووی منالیمان لێ ئەزێـــتەوە
سەروگوێی بەکیان ئەشکان بەکولەك
چەند ایێك خەرێز بووین بەشەڕەگەڕەك
مـــن گوێزەیەمو تۆ کـــانێسكانی
لە یەك بوو بوینە دوژمنی گیـــانی
هیتلەرو یەهود ئەوەندە دوژمن نین
ئەوەندەی ئێمە ایێك هاتووینە قین
ئەو ئیشەیشی کەوا راجع بـــەخوابێ
بەزۆری بازی هیچ لایـــە نـــابێ
پشتیوانەکەت نـــەگەر بـــەکارە
باراش لـــەئاشی زۆروو بـ بهارە
ئەگینە کـــارمان لێرە لە پاشـــە
پیشەی پێشووی دەوەن بەئاشـە
جاران ئینتانیا شـــەرە کای ئەکرد
کەوتیان خراپە پێیان لەناو بـــرد

ئێمە بەرانو کـــەو و کەلەشـــ ێر
تێك بەرئەدەین و سەگ ئەکەین بەشێر
هەموو دەرسی شەڕ ئاخر شەڕی یە
بۆیـــە هەڵکردمان کوێرەوەری یە

ژیـــان : ٤٤٩

گەرمای هاوینەو گەرمەی میوەیـــە
ئاخ میوەی ئەمسـاڵ شەڕای پێڕەیە
کاڵەك گران بوو تەڕم لێ نەخوارد
کەچی کوتو پڕ گەرمای تێ بنارد
خوا نەیداوینێ ساڵێ ئۆخەی کەین
شادیو تـالی ئـەکەوێتە بـــەین
ئێستا وەختێکە بەخۆشیو سەیران
هەموو ئێواران بچنە سەر بێستان
کەچی بـەهیچـە بـــۆ قینە بـــەری
لە خۆش ڕابواردن خۆ دەکەین بەری
عەیز ئاغاو میرزا زیندو بـــوونەوە
شێرزادو شێرخان تێك هەڵچوونەوە

ئـەوە چاکی کرد بۆ لایی توانـــد
لای معاویـــە تیکەی خۆی گلاَنـــد
نـــوێژی لەپشـــتی علیەوە کـــرد
کەبوو بەهەلدا ڕای کردە سـەر گرد
خۆ من لەوسنم، بەلاَم ئـــەو نانـە
کەبۆنی لێ بـــێ نایخۆم گرانـــە
لەپشت کەسەوە جەماعەت ناکەم
بۆ ولاَتەکەم بـــەهیوای چاکـــەم
هەلدایشم ناوێ بۆی بچمە سەرگرد
ئاخ هەموو لایەک ڕەد منیان ئەکرد
ئێمە کەلەسەر هیچـن نـــەکردن
دوو کەس دەمێنێ ئایستەی مردن
خوزگە بۆ چاکی وایەك دەکەوتـــین
بەهیچ قورەتـــی دانەدەکەوتـــین
ژمـــان : ٤٥٠
ئەو دەمە بەختم لێ بڕو بەدوژمـــن
کـــە کەرە دێزم نەر بەرمـــووزن

ئەو دەمە هۆشم لێ شێواو وەستام
کە هەرچی هەڵسا وتی ئاش وەستام
خزمەتی دەکەم هێشتا لێم سواردە
تۆ خوا مەلا گەل ئەمیشە ئاوردە
دەوڵەمەند پارەی بەکەس نەداوە
پارە پەرستی ئەڕوا لەدواوە
ئەوی پێی دەڵێن: وابرۆ دەڕوا
بە هیچ قەوڵێکی ناڵێ بڕوا
ئەوی جڵەوی خۆی دایە دەس خەڵك
ناوی نراوە نەبوون و بێ کەڵك
زەردەواڵەمان جاری ئاڵۆزاند
نانی شەوانمان خوارد گەوجمان نواند
لەهەردوو لاوە تووشی جەزا بووین
تەمێ مان نەخوارد دیسان تێ هەڵچووین
تاریکی شەو ئێوارە دیارە
ئەڵێن: خاکەکەی بەدەم شارە

ژیـــان : ٤٤٣

هەلۆ بەرزو فڕی کەوتە سەر شاری
تیری پەڕی خۆی هێنایە خـــواری
ئەوی نـــەدیەی پیاوی گەورەیـــە
ئەبێ چاك بێژ بێ، دەوران دەورەیە
دلخۆشی نەخۆش : دەرمانی دەردە
خەلك بێزار ئەبێ لە بگرەو بەردە
دوکتۆری هاتوە ئەلێن : کوحالـــە
تێی وەرو ژاون ئەلێی دەجالـــە
بۆ خستەخانەی زورو ڕامکێشە
ڕازیانەم خواردو بوو بەزگ ئێشە
دومەلان بۆیە پێی دەلێن زۆلـــە
بەبێ تۆو دەڕوێ لەو دەشتە چۆلـە
ئەلێن : گولە ژن لەهەموو مالـــێ
ئەگەڕێو دەرپێی لێ هادەمالـــی
من بۆیە بستەم هێندە خۆش ئەوێ
چی لەدلدایە ڕاســـت دەر دەکەوێ

وتیان: پێغەمبەر بە کوڕێدا سەرکەوت
وتی: پەیژەکەی عیسای بەدەس کەوت
کابرا وتویە: میەرۆبی هەی دێ
میەرۆب ئەوەیە کەلە لاوە دێ

ژیان: ٤٥٧

سەرماهات پەرگی هەتیوی دڕی
هەور لەخەرمانی چەلتوکی خوری
ئەمسال ناترسم کە لافاو بەم با
هیچ گوێش نادەمە فیشالی بۆمبا
من دەورەی شەڕی عومومیم دیوە
ئەوەی بترسی دەستی بڕیوە
بۆیە حەز ئەکەم باران ببارێ
لەم بێ ئاویە ڕزگار بێ شارێ
هەموو لەتینوا ئاخ هەلدەکێشن
هێشتا بۆمالان ئاو ڕادەکێشن
هاکینەی گەورەی ئالەتریك هات
خوا هاربێ نوری فەڕ کەوتە ولات

نان و گۆشت نرخی کــەم کرایەوە
پارەی (کیلووات«ا») وەك خۆی مایەوە
بۆ دەسحەسانە پــیاو دەخنکێنن
کەچی لەماسی ڕەسم ناســـێنن
بۆ منتێ ئووتن نــەپرســنەوە
واجاغـی مـاســی نــەبەشـنەوە
بەنی گرژ خەرجی هەوسار هۆنینە
دەزووی خاو تەنها بۆ لەرز برینە
ئەسپی بێ هەوسار زوو بێ جل ئەبێ
پیاوسەر بزێو بێ ئەستۆی شل ئەبێ
ژیان : ٤٨٢
ئەلێن : هار چل شەو ئەژی درۆیــە
کــوا لە مالی هار شینو ڕۆڕۆیە
گوشتەی عارەقەان والە پێش چاوە
ئێوازان هیــچمان لەبیر نــەماوە

(ا) کیلووات = مەبەست نرخی کارەبایە.

ئینسان لەئسیان دروست کراوە
چاوی بە پەردەی خەفلەت پۆشراوە
تاساتەوە نەکا چاو هەڵنابڕێ
ئەکەوێتە چاڵ پەلو پۆی ئەبڕێ
بەدکار لە چاکە خراپەی چی دی ؟!
ئاوایتی بەدی خۆی دێنێتە دی
ئەزانی خووا بۆچ بەد ئەژێنێ ؟!
ئەگەر بەد نەبێ بەدکار ناونێ
تا ئەمان بەنە گردەکەی سەیوان
چاکو خراپە نایەتە مەیدان
فۆمەی وەزیفە کە بوو بە کفن
دەستو پێ لە پیاو ئەبێ بەدوژمن
کە مەرنەموو کە چاو زەق کاتەوە
ئاغایێ لە بیر پیاو ئەباتەوە
ئەمانە ویزەی بەر گوێی بێ عارە
کەس نالێ: مردن هەیە لەم شارە

ژیـــان : ۳۲۳

لەدووی سـیاسەت خۆت مەخەرە بەند
ڕێوی قەوالەی پێبوو پۆستیان کەند
تووخن بە پیاوی سەر چەوت مەکەوە
بەدەست قەرز بدەو بەپێ دووی کەوە
دوو گوێو زبانێ دراوە بـــە تۆ :
دوو ببیەو یەکێ بڵێ لەسەر خـــۆ
دوشمنی ناو خۆت ڕەگ دەر دەکێشێ
دار پڕ ازی لەخۆی نەبێ ناقڵیشـــێ
لە هەمووی هەورێ بـاران نابـــاری
ڕاز کەوتە زارێ ڕاست کەوتە شاری
ئەو کانی یەی ئاوی لـــێ دەخۆیتەوە
بـــەردی تێ مەخـــە تینو ئەبیتەوە
بە سوێندی درۆ خۆت مەخەرە داو
تاریکە شـــەوو کەلالی لە نـــاو

ئەوی ئەیـــەوێ سـەری نەیەشـــێ
بە قەد بەڕەی خۆی پێ ڕادەکێشـــێ
گەڕە کە یەلا بن میللەت سـەردەخەن
دەڵێن دوو ڕێوی شێرێ کەول دەکەن
ئیشـت بەدەسـت بێ هەوات لێ ئەکەن
دار کە بەری گرت پەلی پیاکەدەن

ژمــارە : ۲۲٤

پارە خـــەرجی کەی دەبڕێتـــەوە
بە خـەرج نـەکردن کـــۆ دەبێتەوە
مەعاشی بەلاش بێ پییتەو بێ خەر
دەستی مانا،ووە لەسەر زگی تێـــر
ئاغای تـــەمەعکار هەر دەڵێ : بیـــدە
کەر بە بۆ بەرێ ئەوسا شەهیدە
دێی فـرە کوێخـــا ناحەســـێتەوە
بزن هـــەر جـــارێ دەروتـــێتەوە

کەس و کار لە پیاو جوێ نابێتەوە
تفی بەرەو با ڕەش. نەگرێتەوە
وەختێ کە ژن بوو بە گەورەی گەرەك
بائیتر ئێوە دەس بدەینە خەرەك
بۆ کابرایە ئەم شەڕو حالە
دیارە تەبەقی پڕ: ئاشتی مالە
ڕا دامەنیشە بە دەستی بەتال
تا نەگری دەمێك نادرێ بە منال
ڕاستە دوو میوان لێکیان خۆش نایە
بەلام خانەخوێ لەهەر دوو لایە
قات ڕێك ناکەون گەورەی ئەم شارە
تاریکی شەو ئێوارە دیارە
ژمارە: ۳۲٥
زۆر دارو هەژار وەك سەرماو هەتیو
بزن: هەولی گیان قەساب هەولی پیو
دەولەمەندی ڕژد خۆی هەلنەکێشێ
پارە مێشێکە لە گووش نەنیشێ

لە قاپی نامەرد مەکە دق البـــاب
بۆ گۆشـت بە نەوەك منەتی قەســاب
لە پردی نا مەرد مـــەپەڕە رەوە
چەردە ڕووتت کـــابالەم بـــەرەوە
ئەمڕۆ پێویستە تۆ بەدۆستدەرچی
کە باران نەما کە پەنك بـــۆچی ؟
بەخیل خۆی نایخوا هەولیشی زۆرە
مالی خۆ نەخۆر : بۆ چەکە بـــۆرە
چـرای درۆزن ســـاتێ دەگــرێ
بەرەیش هەر لەلای تـەنکێ دەدرێ
درۆزن ئـــاگر لەمالی بەر بـــوو
وتیان : درۆیە کەسێ بۆی نەچـــوو
سـوحبەتی نادان تـــال ڕابواردنـــە
لەدێوی کەر ڕۆیین تەرس بۆن کردنە
هێندە بەرز مەفڕە ، بلێن : بێ باکە
دیارە بێ باکی هەر بۆ خـوا چاکـــە

تووره‌که‌ی جۆ بۆ که‌ری دێز پێوی :
تۆ پیخی ده‌ویو زه‌ره‌ری خێوی
ژماره : ٣٢٦
هه‌ر چه‌ند دۆست له‌لات وه‌ك براو که‌سه
هێند ناهشۆی هه‌که پێت بلێن : به‌سه
که‌زانیت شه‌وه‌ دزت له‌ سه‌ره
ده‌ست به‌ کلاوی خۆته‌وه بگره
که‌شێر ره‌فت دی برۆ تێپه‌ره
سه‌گی سه‌ر مه‌له : به‌ دوولا وه‌ره
گوێ رانه‌کێشی زۆر که‌س بێ گوێیه
کوته‌ك نه‌زانی قۆناغ له‌ کوێیه
به‌ چه‌نه بازی که‌ نه‌زان دووه
له‌ به‌هه‌شته‌وه کوته‌ك هاتووه
ئه‌وی بۆ مه‌ز‌ه‌ب به‌ چڵو جۆ فێرن
له‌گه‌ل لێکه‌وتی ڕووه‌ر ده‌گێرن

ژیـــان : ۳۲۷

لەڕووی جیهاندا تۆ وەرە پاك بـــە
ئەوسا لە وانەی خەلکی بۆ باك بـە
هیچ کەس لەداوای خەلك ڕزگار نابێ
پیاوی قیین لە زگ قەت بەیار نـابێ
بەهیوای هاوسێ بێ چێشت ئەهێنێ
چاوەڕێ دەست بێ هـــەر هەو ئەبینێ
چاو مەبرەرە دەست خراپ فێر ئەبێ
بە پارووی خەلکی درەنگ تێر ئەبێ
کـــە قەلبی اقبـــال : لابقابی یـــە
بە کەم هەلکردن پادشـــایی یـــە
تا خۆت دۆست لەبی کەس نابێ بە کەس
چەپلە لـــێ نادرێ بە تەنیا یەك دەس
بۆ دۆستت پاکە ، غەیر بێ نەنجامە
مال ڕاوەستا بێ مزگەوت حەرامـــە
بۆ دنیای دەنی دەست بەدەینە دەست
هیچکەس هیچکەسی نابالە بەهەشت

دەوران دەولەتت لەدەست دەسێنێ
بەڵام ناوی چاکە تا سەر دەمێنێ
نییەتت چاك بێ ئیش دەبێتە سەر
درەخت زۆر نەبێ هەر بۆت دێتە بەر
بە چکەچکە قەرز نابڕێتەوە
سەد بەرتیل قەرزێ نابژێرێتەوە
ئەگەر چەسپاندن بێتە سەر تکا
بڵێن: تێکۆشن ئابڕووی تکا
کەمن ئاغایم، تۆیش وەك من ئاغا
بەرە شەرەمان کێ بێ بۆ داخا!!
ئەڵێن: ئاو دێنن، خۆشی خۆشی یە
بۆ هاوین نەبێ ئاومان بۆ چی یە
کێ مەعاش بۆ ناو رەد ئەکاتەوە
(مفتی) ش شەرابی مفت ئەخواتەوە
بەگفت سەروماڵ درێغی نی یە
هاتە کردەوە بایەغی نی یە

هەمــوو ولاتمان شــکور ئاوایــە
نــاوی قــەرەداغ زەردیــا وایــە
هاواری کوردان لە شامەوە هــات
هەواریان بەرز بێ دوور بێ لە نەهات
شام سەحەری دێ سووری سووردارە
تــا لــە ئێمەو دابێ بەشمان هاوارە
ژین ژمارە ٦٠٠ سالی ١٩٤٠ ز
بایەقوش لە سەر شوێنێ بخوێنێ
یــا خێوی ئەمــرێ یــا ئەبڕوخێنێ
ئەم شارە کەوەك بەهەشت ئەنوێنێ
کەرەشەبای بــوو خۆشی نــامێنێ
خوا پاراستوێتی لە ئاگری هیتلەر
یا خــوا بەبێ غــەم تیا بەرینە سەر
کەلەشەڕ دەرچێ خــودامان یــارە
با هەر سەیران بێ لەگەردی یارە
جوولەکە بەقین هامــان ئەتــوژن
ئێستا بــۆچ خوێنی هیتلەر نامژن

ئەمـــل دوژمنی ئـــەوان هیتلەرە
خوێن ڕێژی هیتلەر لەحەد بەدەرە
بەڵام وا تیپری خوای لێ کەوتە کار
هەروا بزانـــن بۆی کەوتنە گـــار
چ خوا بەرداره ئـەم ترس و لـەرزە
ئەم خوێنە گەشە لەڕوی ئەم ئەرزە
بە زگی برسی و بـــەزگی تێریـــن
لێمان ناگەڕێن کە خۆش ڕابوێرین
من هەرگیز بۆ خـــۆم ناپارێمەوە
وا مـــن ڕۆیبـــوم ناگـــەڕێمەوە
بەڵام بە هیوای خـــاکی کوردستان
وەك هەل دەگرێ بێ بە گولستان
دەستەی لاوانی خـــوێندەوارەکان
ئەگـــەر تێکـــۆشن بەدڵو بەگیان
نزیکە خـــاکمان ببێ بەئەکـــسیر
هەموو یەکگەرون بەراو لەد بـــیر

گەدەست لەدەست بێ قووەت لەخوا

. . . . . . .

ژین : ٦٠٦

ئەم دارو بەردەو ئەم شاخە بەرزە
خوا دای ڕشتووە لەنگەری ئەرزە
بۆیە شاخی زۆر لەم ئەرزەدایە
زەمینە کەمان جونبوشی تیا بە
ئەوەندە سەختە نابێ بە ڕێگا
خوا بۆیە هێندە بەفری تی کەکا
بەڕەوەوانەمسال هەڵەدێن لەو ذوارە
داری بەردارە ، جێی سایە دارە
ڕۆژێ هارتاشێک چوو بوو بۆ سەدەر
گەییە کالیەک سێبەری لە سەر
لێی حەسایەوە سەری هەڵبڕی
لقی داری دی بە مشار بڕی
دار هاتە زبان ، وتی : دنیایە
بۆیە بەدکاری وەکوو تۆی تیایە

تا ئەو کەسانەی کەوار ئــەنێژن
قەدریان ئەرکەوێ چاکەیان بێژن
دەشتی شۆرەزار هیچی لێ نارِوێ
لێرە لەسەر بەرد دارو گیا نەڕوی
کێو نموونەیە بۆ حــالی بــەشەر
چەند ماندوو ئەبێ تا ئەگەیتە ســەر
لەگەڵ ســەرکەوتن ئینجا بــەناچار
ملی ڕێ دەگری ، یا اللە ســەرەو خوار
( اکملت لکم دینکم ) کــە هــات
یاری غار گریاو ناو بــە چاویا هات
فەرموو پێغەمبەر تەشریفی ئــەڕوا
عادەتە ، کەمال : زەوالی لــە دوا
ژیــان : ٦٠٧
ئــەگەر لەنوێژا ڕیــا بــنوێنی
خۆت و خەڵک و خوا ئــەخەڵەتێنی
هەندێ کە زیافەت بەسەلام ئەدەن
چاو ەرێی هاتن تۆڵەی پەلامــدەن

هەندێ کەمیوان ناڵێکیان ئەخوا
ئەبێ مسەلی بۆ بێ بە دەوا
پیاوێ بە پیاوێ ئەڵێ ، بەتانە :
دوێنێ خوشکەکەت چوّتە (کارخانە)
ئەڵێ : چوّن بەڕاست ئەمە دێتە دی
ئەڵێ : ژنەکەم بەچاوی خوّی دی
قەدری مانگێ نی یە ، ئاڵەتانە شەو
گەرمانای ستارە ئەخاتە بەرەو
بنیادەم زادەی قەترە مەنی یە
کە کەوتە ڕووی کار هەزار مەنی یە
بە بایەك هەموو عەیشێ بە بادە
کە کەوتیشە ئاو وا لە خاکایە
ئەوی ئەزانی بوّت ناچێتە خاك
مێردی ژن ئەیبا بێ ترس و بێ باك
کورت جاهیل بێ ڕەنجێ بە بادە
میرات میقرۆبی شەڕی ئەو لادە

بەرەنجی شانی خۆت بژی بەستە
پارەی میراتی وەك چڵكی دەستە
قومار ئەهەموو ئیشێ بەد ترە
مەحبوب و شەراب بەنەزەت ترە
کە بیبەیتەوە قەدری نازانی
ئەگەر دۆزانت دڵ پڕ لەزانی

ژین : ٦٠٨

ماڵ لێی نەبەشی کەمتر بەر ئەگرێ
مێو کەنەیبڕی، کەمتر بەر ئەگرێ
ناو بەری گیرا پەنگ نەخواتەوە
رایی بۆ ڕێبوار لێی ئەخواتەوە
ئەوەی بەپارە لە خۆی بنی بۆ
بایی بە هەر چەند ملیۆن بایی بۆ
زمان چاك زۆر کەم قۆرتی دێتە بەر
زمانە کە سەر ئەخاتە خەتەر
کەلەشێر تا کۆل بڕا، بەگیرە
فیتنە هەوێنی نۆ قازان شیرە

سۆفی حەرام خۆر وەك كەڵەشێرە
بانگت بۆ ئەداو بەپیسیشی فێرە
لێستر كە دایكی ئەكەر بەر ئەگری
ڕنەكی ئەكەی گازت لێ ئەگری
بە ئێستریان وت: باوكی تۆ كێیە؟
وتی ڕەسەنی دایەكەم پێیە
خۆر كەهەو نەسەی بەزۆڵ دەرئەچوو
ئەویش وەك ئێستر بەری نەئەبوو
پیاوی ساف دەرون كە لە شیر ئەچێ
بەكری ئاگر لەپڕ هەڵ ئەچێ
ئاوی خوڕ هەر چەندكە ئەترسێنێ
هەر ئاوی مەندە پیاو ئەخنكێنێ
ئاو و پیاو مەندو دۆن بێ بترسە
هەرچیت دی ناوی باوكی بپرسە
ئەو ژنەی كەمێردلای نەنگەویست بوو

. . . . . . . . .

ژیــن : ٦٠٩

ئەو کەسەی کەلووت لە دۆست هەلدەکا
بەنگـــانە چۆنی بـــاوەڕ پــێ دەکـــا
ئەوانەی بـــــەدی ئەهێننـــە دی
ئایا لەچاکــە یەدی چیـــان دی ؟
کەری دێز مەنی جۆی بــۆ ئەپێوی
نۆپینی نـــەوێو زـــانی خـــێوی
دەستەیەك سواری کەمی یەك بوو بوون
بەرێی دەریادا بۆ مەککە ئـــەچوون
یەکێکیان شەڕی لەگەڵ قەپتان کرد
خـــتیانە سەربان لەژوو ریان دەرکرد
لەژەهلی واپۆڕ بوو بوو بە دوشـــمن
ئـــەیوت : نوقم بێ ، فێ و سیا لەمـــن
سیتلەی جووە سەر قەبری نـــاپلیۆن
وتی : ناوداری تەئریخ چۆنی ، چۆن ؟
نالەیەك لەخاك هـــات بەحەزینی :
وتی : وا تۆیش دێی بۆ خۆت ئەیبینی

له داخی ئینگلیز من هاتمه گۆڕێ
ئێستا چۆن به تۆ دنیا ئه‌گۆڕێ ؟ !

ژین : ٦٦٠

ئه‌و که‌سه‌ی که‌ سه‌نگ ئه‌خه‌ڵه ئه‌گۆڕێ
سنگی نایه گۆڕ سه‌نگی ئه‌گۆڕێ
ترازووی لۆره‌ت ئه‌گه‌ر سه‌ر نه‌که‌
ترازووی ئه‌ولات سه‌رت ده‌ر نه‌که‌!
نرخمان گرانه‌و هۆقه‌مان سووکه
ئه‌پارێنه‌وه لای هه‌رئه‌مووکه
مارو دووپشکی دنیا به زه‌برن
بۆ پیاوی زۆردار هاوده‌می قه‌برن
به‌لام فایده‌ی چی ئه‌مانه بۆشه
ئینسان زۆرداره زوڵمی لا خۆشه
ئینسان له نسیان دروست کراوه
بیری ناو بیری له‌بیر نه‌ماوه
ئه‌گه‌ر وایش نه‌بێ، هه‌موو به‌عیبره‌ت
ته‌رکی دنیا که‌ن ، بکه‌ونه عه‌زله‌ت

هەموو دەبینە فریشتەی تەنیا
هیچکەس نامێنێ ڕوو بکاتە دنیا
هیتلەر بۆ دنیا ، دنیای وێران کرد
بە شەڕ ملیۆنێ خەلکی لەناو برد
زاینەزە عەقلی کە ئەویش ئەمرێ
وەلا جەنگیز ناوی بەخوێن ڕێژ ئەبرێ
وا بلێین هیتلەر بۆ خۆی هار بووە
نازانم خەلکی بۆچی لە دووە ؟
بەسەعەت ئلوو هەوا ڕام ئەکەن
بە وەحشەت دنیا بێ ئارام ئەکەن
ئەمەزدە بەجۆش بۆ شایی ناچن
نەمامی عومری خەلك هەلدەپاچن
ئەوانەی کەوا بۆ شەڕ دەبرێن
بێ گومان خۆشیان تیدا دەکوژرێن
ژیـــن : ٦١١
نالەی شەو نالی نالدار نەشکێنێ
زولمی ڕۆژ مالی مالدار نەشکێنێ

هەناسەو زۆردار بەفرو هـــەتاوە
باوەجود ئێســـتا باوەڕ نەمـــاوە
دەستی دز بڕین باو بوو تـــا دوێنێ
ئێستا دەستی دز گورز ئەوەشێنێ
خۆ ( بابی بابی ) نـــەما لەم شـــارە
کەچی دەبینم کەر سواری ســـوارە
کەرە کەی ( عوزەیـــر ) تەنها دەزەڕێ
کەرە شێخ زۆر جار لە ژن دەپـــەڕێ
جاران ڕێی بەغدا لەمەنەوە دوور بوو
مەحەلی چوونی بەغدا مشهوور بوو
ئێستا کە تـــەرەن ڕێی کـــرایەوە
ئەو مەسئەلەیـــە وەرگـــەڕایـــەوە
خورمای کورد کوژە ناوی گۆڕاوە
بەو ناو بردنەیش بـــاوی نەمـــاوە
ئـــەوەتی پـــردی زنجیر نـــەماوە
دیجلە بـــەهاران شـــێتی تـــەواوە

هەر بەو شێتی یە کە کەف دەچێنی
ئەترسـم ڕۆژێ بەسانخکێنی
خورماو پرتەقاڵ لەبەغداوە دێ
لێرەوە تری و هەرمێ بۆ دەچێ
هەردوولا بۆ یەك دیاری دەنێرین
بۆیە بەخۆشی ڕادەبوێرین
ناچارین هیچمان بێ یەك هەڵناکەین
لەگەل یەك پاك بین هەر ڕوولەچاکەین
دوو دەست یەك کەون هێز یان پێك بێنن
ڕەگی درەختیش لە بن دەر دێنن
ژیان: ٦٤٢
زۆردار کە لێکەوت بایەزیدێکە
بای ڕێ کەوت بێ با، یا یەزیدێکە
(ان انسان لیطغی) دیارە
کردەوەی خواری بەندەی بێچارە
هیتلەر بەغرور هاتۆتە مەیدان
( انا ربکم ) ئەڵێ بەجیهان

بەڵام ئەو تەولەی گرتوویەتە هار
نایتەنێ بۆ کەس دەستی رۆژگار
ئەو کەسەی کەوا زۆر بەرز ئەفرێ
کەکەوتە خواری هێلکی ئەبرێ
لەو رۆژەوە خوا دنیای داناوە
هەمووی بە حاری بەکەس نەداوە
ئەو دەرلەتانەی دل برینداران
کێ دەلێ : لەگەل قاتیلدا یارن
برینی نامەق قەرتماغەیش بێنێ
بیر ناچێتەوە : ئێستەی دەمێنێ
دنیا شێواوەو پێشمان نەوییە
سابزالین خواستی خووا بەچییە
دەست بە کلاوی خۆمانا بگرین
بۆ خوێن رشتنی نارەوا بگرین
ئێمە شەرکەرنین هیچمان لێ نایە
بە فێل گرانی دێنینە کایە

ڕازبـــاڵە لەبەر دەرگامان دیـــارە
کەچی زگ ئێشە کەوتە ئەم شارە
کـــاری نارەوا تـــا ســـەر ناهێنی
خوا هەقی بزنی بۆشـــاخ ئەسێنێ
ژیـــن : ٦١٣

گلێنـــەی چـــاوت بکـە بەوێنـــە
عالەم ببینە، خۆت هیچ مەبینـــە
کە بەخودەبینی خۆت لەخۆت کـــۆڕی
زوو لەخۆت ئەکەی شایستەی گۆڕی
بەزەردەخەنە کـــە کەوتیە ڕەخنە
بۆ دیواری قەدر ئەبی بە ڕەخنـــە
تازە پیاگەواوو کە قەرزت بـــاتێ
نەیداتەوە ڕووت لەدوای ســـەعاتێ
بـــەڵام پیاوی کون خزمەتت بکـــا
ئەیەوی ناخۆت نەکـــەس، تێ بکـــا
لەپاش ملەی خەڵک بەو ڕەنگە بڵوو
شەرمەسار نەبی کـــە کەوتیتە ڕوو

کەچاکە ئەکەی مەیلی لەلای کەس
بۆ زەوقی خۆت بێ و خوا بیزانێ و بەس
کەسی هیوادار نائومێد مەکە
خێرت ئەنووسێ بەقەد ڕێی مەککە
دلی هیوادار بشکێ قەزایە
نوێژ قەزای هەیە ئەو بێ قەزایە
هەزار دۆستت بێ هێشتا هەر کەمە
تەنها دوژمنێ سەرمایەی غەمە
ڕۆژگاری بێ کەمال سووک مەگرە
پێغەمبەر فەرمووی فەقیری فەخرە
گریان لەسەر خۆ خەم ئەڕەوێنێ
هەندێ پێکەنین دڵ تێکەڵ دێنێ
دەولەمەندو پیر حیرسیان زیادئەبێ
حەریسیش دیارە کەناشاد ئەبێ
هەتا هەر ناشادە کەوا حەریسە
شەڕە گەڕەلا کەر بەشی هەرلیسە

ژین : ٦١٤

ڕەنج پەیژەیەکە پیاسەرئەکەوی
کەدەستت بەردا بۆ سەر ئەکەوی
بەکردو کۆششی تێکۆشە وەلا شێر
دەستی ماندوە لەسەر سکی تێر
تەمەڵ کە وتی وا هەمە ئەیخۆم
لەدوایا ئەڵێ ئای چیم کرد بەخۆم
کەتۆ بەزانو بەرگی کەس نەبی
لەچیتە ڕیزەی یارانی نەبی
دەست پان کەیتەوە لەپێ ئەکەوی
کەلەپێ کەوتی ئەکەویە تەوی
کەم بخۆی لەشت بێ عیللەت ئەبێ
کەم بڵێی سەرت سەلامەت ئەبێ
چاوت لەنانی دیوانی نەبێ
تێری لێ نەخۆی بە ئەرخە نەبێ
کەوتوینە دەورێ دەورەی ڕیاسەت
بەمەهارەتە نەک بە کیاسەت

خۆێندەوار بۆیە ناخەنە قەڵەم
خۆی بەخوێندەوار ئەداتە قەڵەم
نازانی ئەوی بە عیلم ئەنازێ
هەڵکردی دێتە سەر نان و پیازێ
ڕاستە هەموو چشت بەدەست خودایە
ئەوی تشبث نەکا لە دوایە
چونکە خوا نایە بێ بەکوێخای تۆ
تا خۆت نەیژەنی ماست نابێ بە دۆ
(لیس للانسان الا ما سعی)
لە پێشدا سەعی و لە پاشا دوعا
ژین : ٦١٥
ئەزانی بۆچی ئەم ڕۆژە جوانە
شەو ئاوا دەبێ لێمان پەنهانە
لەبەر ئەوەیە قەدری بزانین
لێی وەڕەست نەبین قەدری بزانین
لەگەڵ ئەوەدا لەلایان وایە
کە ئەم دنیا یە بە ڕۆژ ئاوایە

کەچی هاوینان خەڵکی لێی بێزارە
پیاوی ناز پەروەر لێی بە هاوارە
پەندە بۆ ئەوەی زوو لە پێش چاوە
ئەگەر ڕۆژیش بۆ خەڵک لێی بێزراوە
عەشقیش کە شێتی دێنێ بە سەردا
شوری مانیعە وەسلە لە بەردا
کە ئاشقەو ماشقەزوو بە یەک بگەن
زۆری پێ ناچێ پشت لە یەک ئەکەن
ئێستا دەورێکە هێندەی تێ ناچێ :
کچ لەگەڵ کوڕە، پرچ هەڵدە پاچێ
بۆ یە هیچ کوری بۆ کچ شێت نابێ
پێکەوە لەسەر ژیان و کەبابێ
جاران کوڕ ئەیگوت : جەرگم کەبابە
ئێستا خەنیەی نان و کەبابە
ئای بۆ دەورەی کۆن دنیاچە خۆش بوو
کوڕ بە عەشقی کچ مەست و سەرخۆش بو

بە لۆیە بەرگت و بەنـــان و ئـــلوێ
شابووبەعەشقی مـ ـەر بـەدراوی
ئەگەر تۆ خوای خۆت ئەناسی بەدڵ
هـــەموو مـەراەت بۆتەبێ حاســـڵ
خۆ شەویستی خواخـــەم ئەڕەوێنێ

• • • • •

ژیـــن ٦١٦

دەلەک کە پێستی کەولی شاهانە
ناوی بـــە تســـن لە ناو ناوانـــە
نامر هەلکەوتوو بـە ڕەگەزنی یـــە
مریشکیش ڕەشەو هێلکەی سپی یە
(فزونی لشکر نیایـــــد بـــکار)
چین و ئیتالیـــا کـــەوتنە هـــاوار
ئیتالیـا لنگی دایـــەو تێك شـــکا
(غاریبالدی) بوور ئابرووی تکـــا
ئەمە پاداشـــی بـــێ وەفـــایی یـە
دۆم بەسەرو پێ لە خۆی بـایی یـــە

ئەمانەهەموو بەخواستی خوایە
کێ ئەیوت: یۆنان زوور ئیتالیایە
هەرچی بەرز بفڕێ کەکەوتە خوارێ
سەروگوێلاکی ئەشکێ بە جارێ
لەشکری ئینگلیز کەییە بنغازی
وەك شایی کەران کەوتنە رەبازی
من شەڕم ناوێ با هەر شایی بێ
پلاو خواردنمان باخۆڕایی بێ
سەلکێ چەوەندەر کەییە پێنج ئانە
هێشتا پێم ئەڵێن: بیکڕە هەرزانە
ئەوی کەئەیخوا بە بادی هەوا
پەندوباو پشم ئەخاتە دووا
گوناى ئەو نییە دنیا کەوایە
ڕەهایی ڕوتبە خاوەن کەوایە
هەرچی دەیبینی کوشتەی کورسییە
ئەوی خەڕۆییە بە خۆی برسییە

گا لەسەر پشتی ماسی وەستاوە
بە کورەی تـــرە کەلەگێی ناوە
ژیـــن : ٦١٧
دنیـــا کەوتۆتە خەمو دڵتـــەنگی
هاتوە بە یەکدا وەکوو مووی زەنگی
دیمـــان مووی زەنگی ئالۆزاییـــەوە
قەڕالی حەبەش کەوتـــە کایـــەوە
دەعوای بـــەرانی ڕەش و سپی یـــە
بزانین خواستی خـــودا بە چی یـــە؟
چەند خۆشە ئینسان لە جێیەکی بەرز
سەیری دنیا کا بە بێ ترس و لەرز
( مانا ڤنناس )ئەمری نەوهەرزیندووە
بارکم بەخو خوا ئەمەی کـــردووە
مادەی کەروگای ( کفر نەحمەد )مەقە
وەرە لەداخـــا مەمرەو مەتەقـــە
بەحساب ئەمرۆ پشکۆ لەکـــەوێ
تـــۆفو چلوولەی چلـــە لـــەڕەوێ

خۆز گەئەمسالیش لەکەناری زەلم
لەناو نێرگس‌دا ڕانەکشام وەك بەلم
گناحی پۆڕو هاژەی بەفـراوان
دەنگی ئەدایە بەلــەدی دوو ئـاوان
ساتێ لە ڕادیۆی شۆڕش دوور ئەبووم
ڕاهێوم لێ‌بووە بە ئاوازەی شــووم
جاران جووله‌کـــە خومی ئەشـێوا
بە درۆ پیاویان ئـــەکرد بە کــێوا
ئێستا کارخـــانەی درۆ ڕادێویـــە
هیچ کەس نازانێ گەڕاست لەکوێیە
ئەبێ زەمانەیش هیـچ ڕاستی ناوێ
پیـــاوی ڕاست ئەخەن بە بەندو باوێ
ژیـــن : ٦٢٨
طـــاریێ کە زانیت بۆت ناچێتە سەر
بە هەرۆ و مەڕۆڕاســــت بیدەرە بەر
بـــەردێ کەئەزانێ بیخاتە نــاوانـو
دەرنایـــە بە ســـەد عاقلی بەنـــاو

شووشه که لەبەرد دروست نەکرێ
خۆی گۆڕی بەرگەی بەردێ ناگرێ
چێشتی ئەنگەناز لەشاران باوە
لەمەڕو کەس نایخوا گەرتەشی ناوە
ئەوا کار بەعاقڵ بۆیە ناسپێرێ
ئیش بە هونەری خۆی ئەژمێرێ
یەکێ خەریکی سکەی لەدانە
کیمیا گەرەو موحتاجی نانە
یەکێ خزمێکی لە دووری ئەمرێ
لەپڕ دەوڵەت و خەزنەی ئەبرێ
یەکێ تەحسیلی عالی ئەبینێ
بۆ مەدیریەک دۆشی دادەمێنێ
کەچی لەو لاوە، نەخوێندەوارێ
بوو بە قائمقام، چوونە لای جارێ
وتیان: چیت زیادە لە بوورە نایشی؟
وتی: حەو، خۆ ئەو قەندە ناکێشێ

خوا شیرینی وای بـه بـاره داوه
پاره دار خەلکی ئەروا لـه دواوه
ئالتوون که ناوی به زەر ئـەبری
ناوی زەر دێنی کەر بۆت ئـەزەری
ئەمانـەهـەموو فلسی نـایەنی
پارەی پـارەدار چەنـه یەشێنـی
ژیـن : ٦١٩

پیاوی پییر تا بێت گری کەم لەبی
داری وشك گری وەکو شـەم ئەبی
ئاور پیاوەندو مۆن بێ، بترسـه
سەگی نەڕین گر رامەگره، خـرسه
هەندی ڕوو بە ڕوو زبانیان چـەوره
کەوتە پاش ملە دەم دەمە تـەوره
پیاوی دەم هەراش کە لـەبەرەوەن
شـێری مـالەوەو ڕێوی دەرەوەن
هەندی بەهیوان کە هونـەر باوبێ
بلێ کێ دیـوەیـه زستان هەتاو بێ

زەمانی مەهدی خەیاڵی خاوە
دنیا بەکلکی گا ڕاوەستاوە
تا دەست بەکلکی ئەو گایە نەگری
ئەگەر شێریش بی لەترسا ئەمری
مانگا بەدزی کەڵی ئەگرت جاران
ئێستا کەڵەگا دێنن لەشاران
بەتلیلولی مانگای بۆ دەبەین
ئەم بێ شەرمیە تازە کەوتە بەین
ڕوونبەی حاڵو ماڵ هەموو بۆ زەوقە
کەزەوقت نەبوو ماڵ لەلات نەوقە
خۆ ئەشی زانی کەنایەیتە گۆڕ
نایخۆین بۆ ئەوە کەزۆرتر بێ . . .
ئەم پەندو بەندە کەلەپێشی چاوە
لەڕاستی هەندێ وەک بەندو باوە
سەعدی و نووبە کەبەخۆ بەندی
دەروێشی خۆشە نەك دەوڵەمەندی

لەگەل ئەوەشدا دەولەت شیرینە
ئێمە وەك مێش و دنیـا هەنگوینە
ژیـن : ٦٢٠
پیاو تێر بێ و چاو تێر مەنـو ووەیە
برسێتی رەگی هـاری پێوەیـە
پیاوی تێر ئاگای لە برسی نییـە
بە مال ئەخورێ هیچ ترسی نییـە
چۆن یـەکێ بخوا و ، یەکێ بـڕوانێ
برسی یەخەی تێر لەگرێ بـۆ نانێ
ناوی خۆی نـابوو خـادمی ولات
کە هات بێتە دەر بۆ خۆی کێ ڕۆهات
درۆ شیعرێکی پیـاوی گـوبەندە
ئـاموبالەغەی تیـا بێ پەسـندە
لەبەر ئەوەیە هـەموو شـاعیرێن
کە لە درۆدا هێنـدە مـاهیریـن
ئەم راسـت و چەپەی کەلێـستا بـاوە
خۆزگە ئەمزانی کـێ ناوی نـاوە ؟

دەستی ڕاست بەشی بەهەشت بۆ خوارنە
دەستی چەپ پیشەی تارەق گرتنە
ئێستا چەپ ڕاستی خستۆتە گۆڕێ
ئەشێ وەزیفەی دەستیش بگۆڕێ
ڕەحمەت لە گۆڕی پیر وەیسی خەلك
ئەلێ : مێ : نێرە وێز مینگەی شلك
ئەگەر ژێر کەوتەو ئەگەر هاری یە
ئەم کارەساتە لە بۆ کاری یە
پیاوی سەرمایە کوشتەی سەرمایە
بالەو کوونەوە تا بۆ سەرمایە
ژین : ٦٢١
لە شەڕی بەدکان پشت بە خوابەستە
ئەوە مەبەستە، مەوەستە هەستە
هەرچەند گفتوگۆت بۆ سەروپا بۆ
کەس لێت ناگری گەدلت پا بۆ
دڵ پوس لە هیچە کە دەر ئەبەستێ
هیچ دەر بەست نی یە کەدەر نەبەستێ

بەئیملای کـــۆنەسەروســـر بران
سەرو سر هەد دوو پێکەوە بـــران
دەستت ببەستی دەستت ئەبەستی
بڵندی لەکەی ئەکەویــە پەســـتی
لەئێران باران نــەمام لەمام بـــوو
ئێستا سەر بەرزی نەمام نەمام بوو
لەدادی خوداو دەوڵەمەند گــــەڕێ
وشالاو تەڕ جووتو ئاشی ئــەگەڕێ
هەور گرمانەی ترسنۆك تۆقـــی
وتم: ئۆخەی وا قــاڕچك هەڵتۆقی
بەتوانج ئــەڵێن دەمەلان زۆلـــە
خۆ ئەوەی زۆڵە خەڵان لەکۆلـــە
زستان سەرمای خۆی وەرگێڕایەوە
ڕێویش پێستی خۆی وەرگێڕایەوە
چەشنە ڕێوی یەك نوونە کایـــە
ڕێوی قەمچوغە پێستی پڕ کایـــە

تووله کاری وا ڕووی کرده کابــه
ماری شێخ هۆمەو سەگی ئەسحابە
ژیـــن : ٦٢٢

با، مێخ سندانی فرق داپــه دەر
پێچه کلاویان ئەهاویشـتە بــەر
قەسال خۆی دەرکردبه جوابێکی سارد
کەچی مووی ڕیشی بە ناوتیشان نارد
تفی لەڕووی کرد پێی وت : کەرەتە
وتی قەیناکا بــاران ڕەحمەتــه
کاسه کەچەور بوو ناو ناکرێتە خۆی
گاجووت تێناگا بلوێر ئەمەی بۆی
دار بە پووازی خۆی ئەلێشــێ
گولی دۆست زیاتر لە بەرد ئەیێشێ
ئەگەر ئەتەوێ ئازاده ســەر بــی
ئەبێ بێ شەدەو بێ شمله گەڕ بــی
(پواسوّن داروێل) پیشەی شــاعیره
کەچی زۆر جاهیل تیــاداهــامیره

ئێمە بە مازوان تێ شکاین، بەستین
بەهیوای ئەوەیین بەسیچکان هەستین
شەکرو شۆلك هەر دوو لە قالبێکن
کەچی بە مەعنا چەند دوور لەیەکن
شیعرو شەرع وەهەرش کەرستەیەکە
شیعر لەم دوانە دەلبەستەیەکە
هەرچیت ئەدەنێ ناوی کەرەمە
تەنها جنێوە منەتی کەمە
کەمەردی هیچت لە گەڵا نایە
گوناه هاودەمتە ئەو بەوەفایە

ژین : ٦٢٤

هونەر ئەوەتە شەخست خۆش بوێ
بۆ ئەوانە دووژنان ڕەدوو دەکەوێ
خۆهەلکێشانە بەکردەوەی حیز
چاو لێ کەری یە پێی دەڵێن خەرمیز
ئەمڕۆ پێت دەڵێن لەدەورت گەڕێم
پێت هەڵخلیسکا ئەڵێن لادە لێم

من پیاوی وەهام دیوەو بیستووە
لە تەنگانەدا دۆستی ویستووە
جاران ئەیانگوت کە نەخوێندەوار
لێك ناداتەوە نازایەو بەکار
ئێستا خوێندەوار ئازاو جەسوورە
بەهۆی ئەوەوە میللەت رووسوورە
لەقوربەی بەرزی سەر وولاتەوە
کردەی مەردیە دەنگ ئەداتەوە
ئەو کەسەی کەسەو بەدڕەیا رەشە
کەسیش نەزانێ زەرقێکی بەشە
بەخۆیشی خەیالی دانەوێ زیان
ئەڵێ : (غەرقش کن ماعم دومهان)
دەستێ بۆ کەلکی خەلک درێژ نەبێ
یاخوا برینی قەت ساڕێش نەبێ
ئەگەر پێشی ئەوەی کە دەچیتە خاك
خاك بێ ئەبیتە مەردوەکی بێ باك

خۆ ئەگەر هەوات کەوتــە کەللەوە
لەوشکی شەقی بـە بێ مەلـلــەوە
ژیــن : ٦٢٥

ئەو بێدەستندەی کە مال نا بەخشێ
کەمالی کەمە ، زوو پێی ئەلەخشێ
بە مال دل خۆشکە لەڕێی خــوادا
مێو تاڵەی ڕِی بــەری زۆر نــادا
بە مال دل خۆشکە نەک بەمال دلخۆش
مەچۆرە کەعبە ، بچۆرە سەر نەخۆش
دانا وتوویە : مــال چلکی دەســتە
بە ناوی چاکت پشت بەستە ، بەستە
ئەو کەسەی بەسەر لەفسی یازاڵە
بۆ دێوی لـەفس ڕۆستەمی زالــە
حوشتر لە ڕەنجا بۆیــە ناسرەوێ
بەو زل حۆرتی یە دوای کەر ئەکەوێ
دەلاڵ سنەوقی ئەفرۆشت لە بازاڕ
بە مەڕاج هەراج بۆی کەوتبوەجــاڕ

ئەیوق : ناوی ئەم سندوقە جوانە
بیکرێو ئەیکرێ هەر پەشیوالە
ئەو سەرامی ژنو مندالە
بوونو ئەبوونی عەیشی بۆ کالە
بۆ ژنو مالیەو دوژمنی شەیتان
حەزرەتی عیسای بردە ئاسمان

ژین : ٦٢٦

کار تا ئەشێوێ ئاگاتە سامان
کەوا ئەیکێشی ناگاتە دامان
ئەجوولێتەوە خوێن نایەلە لەش
تەقەللانەدەی نات درێتێ بەش
زەرب المەسەلە بەزبانی ئێران
مەپرسەو لێدە لەتیپی رەفدان
غەوواس کەترسی مەرگی بێتە بەر
ناچێتە دەریاو ناگاتە گەوهەر
هەرچی دێتە پێش حوکمی قەدەرە
لەراستی قەدەر خەلك بۆ سەرە

مەنیشـەبەهۆی چوونو چـەندەوە
بـاز لـەبوارا دێـتە بـەندەوە
جاران بۆ مەسنەد بازیان هەڵئەدا
زۆر جار ئەکەوتە سـەر پیاوی گەدا
ئێستا ئەو کەسەی قودرەت ئەنوێنێ
بەهەڵمەتی بـەختی دژمـن ئەنوێنێ
هەڵدێ لە نادر بۆی هـەڵدەکـەوێ
بە پاڵـەقول دێــوی زوو بۆ دەکەوێ
خوا فەرمووی ] مەندێ چشت ئەکەم‌هێنی
دوایـی دەبینێ کـە خێـر دەبینـێ
ژیـن : ٦٢٧
هونەر ئەوەیە بەدت خـۆش بـوێ
خۆشەویستی چاو بەر تـۆناکـەوێ
خوا بیاوی بەدبین کوێر کا بەتـەواوی
هونەری کەسی نایەتە بـەر چـاو
تـا لە دنیادای مـوحتاجی مـاڵی
بێ مـاڵ لای عەوام وەك بێ کـەماڵی

پیشەزانی پاش خۆت دوشمنت ئەیبا
تۆکۆی کەرەوە مال مەدە بەبا
بەلام ستەمە مال لەگەل کەمال
تۆ مەکەوەرە دووی ئەمری مەحال
ئەگەر ئەتەوێ کە دەولەمەندبی
ئەبێ بەکردەی عەوام پەسەند بی
خوا نەوعێ دەولەت ئەدا بەنادان
سەد پیاوی داناي تیا دەبێ حەیران
بۆ هەلێ کەرەم ئەبێ بەدۆستی
هەندێ بە پارووەدەی ئەبەستی
ئەگەر بەکەرەم دلیش رانەگری
وامەکە خەلکی لە قسەت بگری
خەلکی لە قسەی رەقت سەخلەتە
گەر زبان بێلێ سەرت رەحەلە
هەموو کەسێ خۆی بەپیاو ئەزانێ
خەلکی مەشکێنە بۆ پاروە نانێ

ژیـــن : ٦٢٨

گوڵە بەرۆژە مەجزوبی عەشـــقە
روویی هەر لە رۆژە،ئەمە سەرەمەشقە
نەك فرفرۆکە بە هەموو بـــایە
لەسووڕێتەوەو رەنجی بــە بایـــە
مەلاسەت هەرکەسێ ئەموستی پیاکا
دەم دەکاتەوە فەرقی کەس نـــاکا
پێموت: چـی هـــەیە بڵێ بزانم؟
وتی : نازانم رەحـــەتـــی گیـــانم
کە تۆ نەتوێرا دەم بکـــەیـــەوە
مەچۆرە جەنگـــی جەمو کەیـــەوە
تۆ لەچاو خەڵکاوەڵانێر کەکاردووی
ئەم دنیایەیان بۆ لەسپـــاردووی
ئەگەر ئەتەوێ دایم لەپێش بـــی
ئەبێ بەچەپڵە هەلهەلەکێش بـــی
بەم شارە ئەڵێـــن : شاری رەشەبـا
ئاگـــات لێ ئەبێ کلاوت نـــەبـــا

جاران بۆ ماسی زۆر تەنگ تەر ئەبوو
چەن تۆڕ ئەپچڕا.چەن داو بەر ئەبوو
ئێستا سەد ماسی ئەگرن تەر نابن
بۆرەسەی ماسیش تووشی گەڕنابن

( * * * )

چاوەڕوانی :
( ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد )ی
مامۆستا ئەمین فەیضی بن .

# الجـزء الاول

## مـن

# حكميـــات پيرەميـــرد

ژمـارەی سپاردن بەکتێبخانەی نیشتمانی بەغداد

٢٧٢ / ١٩٨٤

٨٠٠٠ — ١ /٣/ ١٩٨٢

نرخی « ٥٠٠ » فلس